زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# نووح پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت





زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# نووح پێغەمبەر

## سەلامی خوای لێبێت

بسم الله الرحمن الرحیم


ناوی نامیلکە: نووح پێغەمبەر

(سەلامی خوای لێبێت)

ئامادەکردنی: محمد عەلی قەرەداغی

چاپ و دیزاین: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

تیراژ: ( ٢٠٠٠) دانە

نرخ: ( ١٥٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( ١٧٦٧) ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە


ARA Media Center

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

لە نێوانی حەزرەتی ئادەم (عليه السلام) و حەزرەتی نووحدا (عليه السلام) نزیکەی هەزار ساڵ بوو. ئەو ماوەیە خەڵك خودای تاك و تەنیایان دەپەرست. لە سەردەمی حەزرەتی نووحدا (عليه السلام) خەڵك ڕێگەی یەکتاپەرستییان ونکردو، دەستیان کرد بە بتپەرستیی. نووح لەناو ئەو گەلەدا گەورە بوو، ڕەفتاریانی بەدڵ نەبوو، ئەیزانی ئەو بتانە دارو بەردنو هیچ سوودو زیانیان نیە.



بۆیە نووح (عليه السلام) بیری ئەکردەوە بۆ ئەوەی
نەکەوێتە ئەو سەرگەردانیەی گەلەکەیی
تێدایە. خودای پەروەردگار خستیە سەر
ڕێگەی خوداناسیی ڕاستیی. کردی بە
پێغەمبەرو هەڵی بژارد بۆ ئەوەی
گەلەکەی بانگ بکا بۆ خودا
بەیەك ناسیی و دوورکەوتنەوە
لە گومڕایی.



نووح عليه السلام زۆر مەبەستی بوو گەلەکەی بخاتە سەر ڕاستەڕێگەی خوداناسیی و بێ وچان و ماندووبوون نزیکەی هەزار ساڵ شەو و ڕۆژ بە ئاشکراو بە نهێنیی ئەو گەلەی لە ئەنجامی گومڕایی دەترسان و بانگی دەکردن بۆ لای خوداناسیی و ڕێگەی راست و دروست.



گەلی نووح ئەو ماوە دوورو درێژە لەسەر ئەو گومڕایی و سەرسەختییە مانەوەو ژمارەیەکی کەمیان نەبێ لە هەژاران و لاوازەکان باوەڕیان بە نووح عليه السلام نەهێناو، گاڵتەیان پێ دەکرد.



ئەو گەلە گومڕاو سەرسەختە لە باتیی ئەوەی گوێی لێ بگرن و شوێنی بکەون پەنجەیان دەئاخنی بە گوێیانداو سەری خۆیان دادەپۆشیی بۆ ئەوە نووح ﷺ نەبینن و بانگەوازەکەی نەبیستن.





کاتێ نووح عليه السلام دوای ئەو ماوە دوورو درێژە لەهاتنە
سەر ڕێگەی گەلەکەی هیوابڕاو بوو لە خودای مەزن
پاڕایەوە کە سزای سەختیان بدا بەسەردا.
خودا فەرمانی بە نووح دا کە کەشتییەکی گەورە
دروست بکات و، لە هەموو نێرو مێیەك
جووتێکی تێ بخات.



حەزرەتی نووح (عليه السلام) دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتییەکە. کاتێ کەشتییەکەی تەواو کرد، خودا فەرمانی بە ئاسمان دا بارانی بەخوڕی باراند، زەویی لەهەموو لایەکەوە ئاوی لێ هەڵقولا. تەنانەت لە تەنوورەوە ئاو سەری کرد، زەویی بوو بە دەریا، خەڵك بە هەڵەدەوان بۆ جێگەیەك دەگەڕان لە لافاو بیانپارێزێ.

حەزرەتی نووح (عليه السلام) خۆی و هاوباوەڕەکانی سواری کەشتییەکە بوون و لە هەموو نێرو مێیەکی گیانلەبەرانیش، وەك خودا فەرمانی پێدابوون، جووتێکیان خستە کەشتییەکە.



کەشتی کەوتە سەر ئاوو کافران دەخنکان، نووح (عليه السلام)
چاوی لە کوڕەکەی بوو، کە لەگەڵ کافراندا بوو.
پەلەقاژەی ئەوەیەتی خۆی ڕزگار بکا، بانگی کرد:
وتی: کوڕم وەرە لەگەڵ ئێمە سواربە. بەڵام ئەو گومڕا
بوو وتی: دەچمە سەر کێوێك و ناخنکێم، چونکە
جگە لەلای خودا پەنایەك نەمابوو
کێو داڵدەی نەداو خنکا.



دوای ئەوەی هەموو کافران خنکان و خودا سەرزەویی
لێ پاك کردنەوە، فەرمانی دا باران خۆشی کردەوەو،
زەویی ئاوەکەی قووتدایەوەو کەشتییەکە لەسەر کێوی
(جوودی) نیشتەوەو، نووح عليه السلام درێژەی بە بانگەوازو
خواپەرستیی دا تا کۆچی دوایی کرد.

